# تفسير الـسلف

## تەفسیری قورئان

## ﴿لێکدانەوەی پێشین بۆ سورة الفاتحة﴾

نوسین و ئامادەکردنی:

عبدالله الكردى

بسم الله الرحمن الرحيم

ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتووک: تفسیر السلف

نووسین و ئامادەکردنی: عبداللّٰه الکردی

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم، ١٤٤٥ کۆچی – ٢٠٢٤ میلادی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە « »ی ساڵی «٢٠٢٤»ی پێ دراوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له وأشهد أن لا اله إلا الله وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.
﴿يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله حق تقاته ولا تموتن إلا وأنتم مسلمون﴾.

﴿يا أيها الناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منها رجالاً كثيراً ونساء واتقوا الله الذي تساءلون به والارحام إن الله كان عليكم رقيبا﴾.

﴿يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله وقولوا قولا سديدا، ييصلح لكم أعمالكم ويغفر لكم ذنوبكم ومن يطع الله ورسوله فقد فاز فوزا عظيما﴾..

أما بعد: فإن أصدق الحديث كتاب الله، وخير الهدي هدي محمد صلى الله عليه وسلم، وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار.

# دەسپێك

﴿الحمدلله رب العالمين﴾

بە ناوی خوای گەورە و بەرز و بێ هاوتا درود و سەلام لەسەر پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ، وەلەسەرخانەوادە و شوێنكەوتووانی بێت تا ڕۆژی دوایی.

سوپاس و ستایش بۆ الله تعالى بە فەزڵ و منەتی توانیم نامیلكەیەكی كورت و پوخت دەربارەی ئایەتەكانی ﴿سورة الفاتحة﴾ بنووسم بە لێكدانەوەی زاناكانی پێشین. تاكو ببێتە جێگای ڕەزامەندی خوای گەورە، پاشان ببێتە سوودێك بۆ هەموو موسوڵمانێكی مولتەزیم و موەحید لەم سەردەمی غوربەتی ئیسلام نامۆ بوونی شوێن كەوتووانی ئەم ئیسلامە ئەم قورئانە ، قورئان وتەو كەلامی خوای گەورەیە ئارامی و ئومێدی دڵانە پێویستە هەموو موسوڵمانێك خۆی تەرخان بكات بۆ كەلامی خوای گەورە فێری ببێت كاری پێ بكات بیخوێنێتەوە، وە هەموو موسوڵمانێك لە شەو ڕۆژێكدا پێنج نوێژی لە سەر واجب و فەرز كراوە، جا پێویستە بە نیەت پاكی و ئیخڵاسەوە بیكات بۆ الله تعالى، بۆیە هەموومان لەشەو ڕۆژێكدا پێنج جار بەرامبەر الله دەوستین سورة الفاتحةی بەرامبەر ئەخوێنین، بۆیە پێویستە لە سەر هەموو موسوڵمانێك بە منداڵ و گەنج و پیرەوە مانای ئەم سورەتە گەورەیە بزانین و بیری لێ بكەینەوە ئاگاداری دڵەكانمان بین لە كاتی وتنی ئەم ئایەتە گەورانە تا ببێتە ئارامی دڵان و چێژی ئیمان لەناو دڵ و جەستەماندا.

# پێشەکی

دەست پێ دەکەم بە ئایەتێکی قورئان.

قوله تعالى ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ أَمۡ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقۡفَالُهَآ﴾[1]

واتە: ئایا هەر بەرەو گومڕایی دەچن و بیر لەم قورئانە ناکەنەوە یان دڵەکان قفڵ کراون و هیچیان تێ ناچێت.

دەربارەی پێویستی خوێندنی الفاتحة لە گشت نوێژدا.

١.عن عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِت رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال: «لا صلاة لمن لم يَقْرَأْ بفاتحة الكتاب».[2]

واتە: لە عوبادەی کوڕی سامتەوە (خوا لێی ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەفەرمووێت: هەر کەسێک لە نوێژدا، (سورەتی الفاتحة) نەخوێنێت؛ ئەوا نوێژی نەکردووە، دروست نیە قبوڵ ناکرێت.

نوێژی نەکردووە کەسێ کە (فاتیحە) لە نوێژدا نەخوێنێ.



[1] - سورة محمد - اية ٢٤.

[2] -[صحيح] - [متفق عليه].

## شیکردنەوە

سورەتی الفاتحة بە دایک ورۆحی قورئان دادەنرێت، چونکە سوپاسگوزاری وسیفاتە بەرزەکانی پەوەردگاری تێدایە، وباسی هێز و موڵک و دەسەڵاتی خودا وهەروەها ڕۆژی قیامەت وپاداشت وپەرستن و مەبەست (نیەت)ی تێدایە، ولەم سورەتە جۆرەکانی تەوحید (یەک خوا پەرستی) وئەرکە شەرعییەکان باسکراوە. بۆیە فەرزە لە هەموو ڕکاتێک بخوێندرێت، ودروستی نوێژ بەندە بە خوێندنی ئەم سورەتەوە، ولە ڕوانگەی شەریعەتەوە لە هەقیقەتدا ناوەڕۆکی نوێژ بوونی نیە بە بێ خوێندنی ئەم سورەتە.

٢. لە فەرموودەی تردا هاتووە: (لاتجزئ صلاة لايقرأ فيها بأم القرآن)[١]، واتە: (ئەو نوێژەی کە -سورەتی الفاتحەی تێدا ناخوێندرێت: کامڵ و دروست نییە، هیچ نوێژێک دروست و و تەواو نیە کە دایکی قورئانی (الفاتحة) تیا نەخوێنرێ .



١ -(رواه إبن حبان و إبن خزيمة صحيح).

٣. فەرموودەیەکی تر:

عن أبي هريرة عن النبي ﷺ قال: (من صلى صلاة لم يقرأ فيها بأم القرآن فهي خداج -ثلاثا- غير تمام)[١].

واتە: لە (ابوهریرە) دەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک نوێژ بکات (ام القران) تیا نەخوێنێ ئەوە نوێژەکەی ناتەواوە، ناتەواوە، ناتەواوە سێ جار وای فەرموو ، کەم و کورتی تێدایە.



[١] -(رواه مسلم وأحمد صحيح).

## دەربارەی باشترین تەفسیر.

بۆ گەڕانەوە و ڕاڤەکردنی قورئان باشترین تەفسیر و لێکدانەوە ئەمەیە کە هاوەڵان و تابیعین و آتباعی تابیعین لەسەری بوون و ڕاڤەیان کردووە کە شایەتی خەیریان بۆ دراوە لە لایەن ( پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ) لەوانە تەفسیری ﴿الطبری، ابن ابی حاتم، مجاهد، الضحاك ،ابن عباس،إبن قتيبة الدينوری، ابن ابی زمنين، عبدالرزاق الصنعانی، مقاتل بن سليمان، ابن مسعود، وغيرها﴾ جگە لەمانە خوای گەورە لە هەموویان ڕازی بێت، بێگومانە ئەمانە لە گەورە موفەسیرەکانن وە باشترین تەفسیرن بۆ ڕاڤەی و لێکدانەوەی کەلامی خوای گەورە ، وە یەکێکی تر (موسوعة تفسير المأثور) ئەمیش یەکێکە لە تەفسیرە باشەکان کۆکراوەی تەفسیرەکانە هەمووی لێرە باس کراون ئەوانەی پێشین، لێرەدا دەست بە ڕاڤەی سورة الفاتحة دەکەین .

**تێبینی:** تەنیا ناوی موفەسیرەکان نووسراوە وە لەگەڵ ڕاڤەو لێکدانەوەی دەربارەی ئایەتەکان چۆن بووە بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی کورت و پوخت بێت ئاسان بێت بۆ تێگەیشتن ، وە ئاماژەیەکم کردووە بە ناوەکانی (سورة الفاتحة)، وەهەروەها ڕاڤە و تەفسیر و لێکدانەوەی ئایەتەکان وەر گیروان لەو تەفسیرانەی کە لەسەرەوە ئاماژەم پێکردوون وە جگە لە مانە.

بسم الله الرحمن الرحيم

ثبتت لسورة الفاتحة عدّةُ أسماء، هي:

١- فاتحة الكِتاب .
٢- أمُّ القرآن .
٣- أُمُّ الكِتاب .
٤- السّبْع المَثاني .
٥- القُرآن العظيم .
٦- سورة الحَمْد.

قال الله تعالى :

وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾

الحجر : ٨٧

أي ولقد آتيناك -أيها النبي- فاتحة القرآن, وهي سبع آيات تكرر في كل صلاة, وآتيناك القرآن العظيم.

(التفسير الميسر)

# سُورَةُ الفَاتِحَةِ ١

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ٢ ٱلرَّحْمَٰنِ

ٱلرَّحِيمِ ٣ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ٤

إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ٥

ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ٦ صِرَٰطَ

ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ

عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ٧

وَآيَاتُهَا سَبْع

## ﴿سُورَةُ الفَاتِحَةِ﴾

١. تەفسیری ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾
بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان.

إبن عباس دەفەرمووێت: ﴿بسم الله﴾ ناوێکە لە ناوەکانی خودای گەورە و بەرز و مەزن، و هیچ شتێک لە نێوان خۆی و گەورەترین ناوی خودادا نییە جگە لە ڕەشبوونی چاو و سپیبوونی بەهۆی نزیکییەوە.

إبن عباس دەفەرمووێت: یەکەم شت کە جبریل علیه السلام دایبەزاند بۆ محمد ﷺ ئەوە بوو پێی وت: ئەی محمد پەنا بگرە بە السمیع العلیم (دوو ناوی الله تعالى)ن لە شەیتانی دەرکراو ، پاشان پێی وت بڵێ ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ پاشان پێی ووت بەناوی الله ئەی محمد ﷺ.

إبن عباس لە تەفسیرەکەیدا دەفەرمووێت: بخوێنە بە زیکرو یادکردنی پەروەردگارت، هەڵسە و دانیشە بە یادکردنی پەروەردگارت.

إبن عباس دەفەرمووێت: گەورەترین ناوی خودا اللهیە.

الأعرج دەفەرموویت: گەورەترین ناوی خودا اللّٰەیە ، مەگەر ئەی نابینیت لە هەموو قورئاندا پێش هەموو ناوێک بەناوی اللّٰه دەست پێدەکات.

تەفسیری ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەخشندەی میهرەبان.

العرزمي دەفەرمووێت: ﴿الرحمن﴾ مانایی ڕەحمەتە بۆ هەموو دروستکراوەکان، ﴿الرحيم﴾ بەڕەحم و میهرەبانە بۆ ئیماندارەکان.

إبن عباس دەفەرمووێت: دوو ناوی ناسکن هەریەکەیان لەوی تریان ناسکترە، ﴿الرحمن الرحيم﴾ واتە : نەرموونیان وبەسۆزە اللّٰه تعالى بۆ ئەو کەسانەی کە پێیان خۆشە ڕەحمیان پێ بکرێت، وە دوورە ئەو ڕەحمەتە لەو کەسانەی کەوا پێیان ناخۆشە ڕەحمیان پێ بکرێت و ڕقیان لەو ڕەحمەتەی اللّٰه تعالى یە.

إبن جرير الطبري دەفەرمووێت: ﴿الرحمن﴾ بۆ گشت دروستکراوەکانە، ﴿الرحيم﴾بۆ ئیماندارانە.

الضحاك دەفەرمووێت: ﴿الرحمن﴾ بۆ هەموو مەخلوق و دروستکراوەکانە ﴿الرحيم ) تایبەتە بۆ ئیمانداران.

مقاتل بن سليمان دەفەرمووێت: دوو ناوی ناسکن یەکێکیان لە یەکێکی تریان ناسکترە.
دەفەرمووێت: ﴿الرحمن﴾واتە بەخشندەو میهرەبان واتە الله تعالی میهرەبانە بەزەیی هەیە، ﴿الرحيم) واتە ئەوەی بەزەییدارە و بە ڕەحمە.

الضحاك دەفەرمووێت: ﴿الرحمن ﴾واتە بە ڕەحم و میهرەبانە لە دونیا و ئاخیرەت، ﴿الرحيم) واتە میهرەبانە لە ژیانی دوای مردن قیامەت.

الضحاك دەفەرمووێت: ﴿الرحمن﴾واتە میهرەبانە بۆ ئەهلی ئاسمان ئەوانەی گوێڕایەڵی دەکەن ئەمانیش فریشتەکانن والله اعلم، ﴿الرحيم﴾ بۆ ئەهلی زەوییە واتە ئەوانەی پێغەمبەرانی بۆ ناردوون و کتێبە پیرۆزەکانی بۆ دابەزاندوون ئەوانەی گوێڕایەڵ بوون والله اعلم.



٢.تەفسیری ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾

سوپاس و ستایش هەر شایستەی خوایە و بۆ خوایە، کە خاوەن و پەروەردگاری هەموو جیهانیان و هەموو بوونەوەرە.

ئەبو جەعفەڕی کوڕی جەریر دەفەرمووێت: مانای ﴿الحمدللە﴾ستایش کردنی خوایە بە دڵسۆزی جگە لەو شتانە کە دەپەرسترێ جگە لەو ، بە هۆی بەخشینی ئەو بەهرانەی کە لە ژمارە نایەت کە داویەتی بە عەبدەکانی. هیچ کەس پەی بە ژمارەی نابا جگە لە خودا خۆی ، وە ڕێکخستی ئەندامەکانی مەردم بۆ گوێڕایەڵی و بەندایەتی کردنی ، توانینی ئەندامەکانی لاشەی ئەوانی کە پێیان سپێراوە هەڵسن بەفەرزەکانی ، لەگەڵ ئاسانکاری بۆیان لە بەدەست هێنانی بژێوی ژیان لە دونیاداو بە دەست هێنانی گوزەرانێکی خۆش بۆیان، کە شایەنی ئەوەش نین کە پێت داون ، وە ئاگاداری کردوون لەو هۆکارانە کە بەرەو ژیانێکی هەتا هەتایی دەیان بات، وە ماڵێکی هەمیشەیی لە بەهەشتی بەرینی نەبڕاوەشدا ، سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگارمان لەسەر ئەو بەهرانەی هەموو لە گشت کاتێکدا.

إبن جریر الطبری دەفەرمووێت: ﴿الحمدللە﴾ستایشێکە خودا خۆی کردوویەتی لەسەر خۆی، لە نێوانیشا دیارە کە فەرمان دەکا بە عەبدەکانی کە سوپاس و ستایشی بکەن ، وەک ئەوە وایە کە بفەرمووێ:

بڵێن سوپاس و ستایش بۆ خودای گەورە، وە وتی : وتراوە، ئەو کەسەی دەڵێ سوپاس بۆ خودا، ستایشی خودایە بەناوە پیرۆزەکانی و سیفەتە بەرزەکانی. وە کە دەڵێ : ﴿الشكر لله﴾سوپاس بۆ خودا لەسەر دەسەڵات و بەهرەکانی.

إبن عباس دەفەرموویت: جبريل عليه السلام بە پێغەمبەری ﷺ فەرموو : ئەی محمد ﷺ بڵێ : ﴿الحمدلله﴾

إبن عباس دەفەرموویت: جبريل عليه السلام بە پێغەمبەری ﷺ وت: ئەی محمد بڵێ ﷺ: ﴿الحمدلله رب العالمين﴾، هەروەها جبريل عليه السلام وتی: ئەی محمد ﷺ بڵێ : سوپاس و ستایش بۆ ئەو اللهیەی کە دروستکردن هەر هی ئەوە، هەموو ئاسمانەکان بەوانەشەوە کە تیایاندایە، هەموو زەوییەکان بەوانەشەوە کە تیایاندایە. وە ئەوەی کە لە نێوانیاندایە ئەوەی کە زانراوە و نەزانراوە، وە ﴿جبريل عليه السلام﴾

وتی: ئەی محمد ﷺ بزانە کە پەروەردگارت لەهیچ شێتک ناچێت.

إبن عباس دەفەرموویت: ﴿الحمدلله﴾ واتە سوپاس بۆ الله ، قبوڵکردن و ملکەچ بوون بۆ الله، داننان بە نیعمەتەکانی و هیدایەتی و جگە لەوەش.

كعب الأحبار دەفەرمووێت: ﴿الحمدلله﴾ ئەمە ستایشکردنی اللهیە سبحانه وتعالى.

سوفیان الثوري دەفەرمووێت: ﴿الحمدلله﴾ واتە ستایش بۆ خودا، زیکر و سوپاس و ستایش تەنها بۆ خودایە . زیکر و سوپاس و ستایش بۆ هیچ شتێکی تر نیە لە غەیری خودا. والله اعلم.

تەفسیری ﴿**رب العالمين**﴾.

پەروەردگاری هەموو جیهانیان.

إبن ابي زمنين لە تەفسیرەکەی دەفەرمووێت: ﴿الحمدلله﴾ الله ستایشی خۆی کردووە ، وە ئەمر و فەرمانی بە عەبدەکانی کرد سوپاس و ستایشی بکەن، ﴿والحمد﴾ واتە ستایش، سوپاسگوزاری بۆ نیعمەتەکان، ﴿رب العالمين) دەڵێت واتە جیهانەکانی دروستکرد .والله آعلم.

مقاتل بن سليمان دەفەرمووێت: ﴿**الحمدلله**﴾ واتە شوکر و سوپاس و ستایش بۆ الله، ﴿**رب العالمين**﴾ واتە پەروەردگاری الجن و الإنس. دەلیل هێناوەتەوە ﴿**لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا**﴾ [1]

[1] - سُورَةُ الفُرْقَانِ: ١].

إبن عباس و سعيد بن جبير و مجاهد و إبن جريج  دەفەرموون: ﴿رب العالمين﴾ واتە: پەروەدگاری الجن و الإنس .

إبن قتيبة الدينوری لە تەفسيرەكەی دەفەرمووێت: ﴿رب العالمين﴾ واتە پەروەردگاری الجن  و الإنس والملائكة، دەڵێت هەموو چينێک جيهانێكە.

قتادة دەفەرمووێت: ﴿رب العالمين﴾ واتە پەروەردگاری هەموو بوونەوەران، هەموو چينێک جيهانێكە، دەفەرمووێت: ئەمە چ وەسفێكە بۆ دروستكراوەكانی.

أبي إسحاق الزجاج دەفەرمووێت: ﴿رب العالمين﴾
واتە پەروەردگاری هەموو دروستكراوەكان لە دونياو ئاخيرەت.

إسماعيل السدي دەفەرمووێت: ﴿رب العالمين﴾
دەليل هێناوەتەوە ﴿لِيَكُونَ لِلۡعَٰلَمِينَ﴾[1] دەفەرمووێت: واتە پەروەردگاری الجن والإنس.



[1] - سورة الفرقان :١.

٣.تەفسیری ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەخشندەی میهرەبان.

العرزمي دەفەرمووێت: ﴿الرحمن﴾ مانایی ڕەحمەتە بۆ هەموو دروست کراوەکان، ﴿الرحيم﴾ بەڕەحم و میهرەبانە بۆ باوەڕداران.
إبن عباس دەفەرمووێت: دوو ناوی ناسکن هەریەکەیان لەوی تریان ناسکترە ﴿الرحمن الرحيم﴾ واتە : نەرموونیان وبەسۆزە الله تعالى بۆ ئەو کەسانەی کە پێیان خۆشە ڕەحمیان پێ بکرێت ، وە دوورە ئەو ڕەحمەتە لەو کەسانەی کەوا پێیان ناخۆشە ڕەحمیان پێ بکرێت و ڕقیان لەو ڕەحمەتەی الله تعالى یە.
إبن جرير الطبري دەفەرمووێت: ﴿الرحمن﴾ بۆ گشت دروستکراوەکانە، ﴿الرحيم﴾ بۆ ئیمانداران‌ە.

الضحاك دەفەرمووێت: ﴿الرحمن﴾ بۆ هەموو مەخلوق و دروستکراوەکانە ﴿الرحيم﴾ تایبەتە بۆ ئیمانداران.

مقاتل بن سليمان دەفەرمووێت: دوو ناوی ناسکن یەکێکیان لە یەکێکی تریان ناسکترە.
دەڵێت: ﴿الرحمن﴾ واتە بەخشندەو میهرەبان واتە الله تعالى میهرەبانە بەزەیی هەیە، ﴿الرحيم﴾ واتە ئەوەی بەزەییدارە و بە ڕەحمە.

الضحاك دەفەرموویت: ﴿**الرحمن**﴾ واتە بە ڕەحم و میهرەبانە لە دونیا و ئاخیرەت، ﴿**الرحیم**﴾ واتە میهرەبانە لە ژیانی دوای مردن قیامەت.

الضحاك دەفەرموویت: ﴿**الرحمن**﴾ واتە میهرەبانە بۆ ئەهلی ئاسمان ئەوانەی گوێڕایەڵی دەکەن ئەمانیش فریشتەکانن واللە اعلم، ﴿**الرحیم**﴾ بۆ ئەهلی زەوییە واتە ئەوانەی پێغەمبەرانی بۆ ناردوون و کتێبە پیرۆزەکانی بۆدابەزاندوون ئەوانەی گوێڕایەڵ بوون واللە اعلم.



٤ .تەفسیری ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾
خاوەنی ڕۆژی سزاو و پاداشت دانەوە.

إبن عباس دەفەرمووێت: ﴿ملك يوم الدين﴾ واتە هیچ کەس و شتێک دەسەڵاتی نیە لەگەل ئەوا (الله تعالى) لەو ڕۆژەدا حوکم بکات ، وەک ئەوەی لە دونیا هەیانە، پاشان فەرمووی: ﴿يَوۡمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ صَفّٗاۖ لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنۡ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَقَالَ صَوَابٗا﴾[1]

پاشان فەرمووی: قوله تعالى ﴿وَخَشَعَتِ ٱلۡأَصۡوَاتُ لِلرَّحۡمَٰنِ﴾[2]

پاشان فەرمووی: قوله تعالى ﴿وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ﴾[3]

إبن عباس دەفەرمووێت: ﴿يوم الدين﴾ ڕۆژی لێپرسینەوەیە لە بەندەکان و دروستکراوەکان، کە ڕۆژی قیامەتە، حسابیان لەگەڵدا دەکات بە کردەوەکانی خۆیان پاداشتیان ئەداتەوە، چاکە بە چاکە و خراپەش بە سزاو تۆڵە لێسەندن، جگە لە کەسێک نەبێ کە عەفوی کردووە لێی خۆش بووە، بڕیار و فەرمان هەر هی خۆیەتی پاشان فەرمووی : قوله تعالى

[1] -[سُورَةُ النَّبَإِ: ٣٨]،
[2] - [سُورَةُ طه: ١٠٨]،
[3] -[سُورَةُ الأَنبِيَاءِ: ٢٨].

﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ﴾[1]
هاوەڵەكان و تابعین و پێشینەكانیش هەروایان وتووە.

الضحاك دەفەرمووێت: لە إبن عباس وە: ﴿الملك يوم الدين﴾ واتە: خاوەنی ڕۆژی تۆڵەو پاداشتدانەوە وە دەفەرمووێت: هیچ كەسێ لەو ڕۆژەدا لەگەڵ خودا هیچ دەسەڵاتێكی نیە و خاوەنی هیچ شتێك نیە، وەك لە دونیادا خاوەنی بوون.

إبن مسعود ڕیوایەت دەكات لەبەشێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: دەبارەی ﴿ملك يوم الدين﴾
دەفەرموون: بریتیە لە ڕۆژی حساب قیامەت.

قتادة دەفەرمووێت: ﴿يوم الدين﴾ ئەو ڕۆژەیە كە (اللّٰه) حساب لەگەڵ بەندەكانی دەكات لەسەر كردەوەكانی خۆیان.

مقاتل بن سليمان دەفەرمووێت: ﴿ملك يوم الدين﴾ واتە: ڕۆژی لێپرسینەوەو حساب، قوله تعالى ﴿أَءِنَّا لَمَدِينُونَ﴾[2]

---

[1] - [سُورَةُ الأَعۡرَافِ: ٥٤].

[2] -سُورَةُ الصَّافَّاتِ: ٥٣

دەفەرموویت: واتە ڕۆژی لێ پرسینەوە ،وە دەڵێت ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە پادشاکانی دونیا حوکمڕانی دەکەن لە دونیادا، بۆیە خودای گەورە ئاگاداری کردوینەتەوە کە لە ڕۆژی قیامەتدا جگە لە غەیری(اللّه) کەس حوکمڕانی ناکات ، وە دەفەرموویت: قولە تعالى ﴿وَٱلْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ﴾[1]

مجاهد دەفەرموویت: ﴿الدين﴾ واتە ڕۆژی حساب و لێپرسینەوە.

الضحاك دەفەرموویت: ﴿الدين﴾ ڕۆژی جزاء پاداشت، دەڵێت واتە ئەو ڕۆژەیە (اللّه) لێپرسینەوە لەگەڵ بەندەکانی دەکات لەسەر کردەوەکانی خۆیان، دەلیل دەهێنێتەوە،
قولە تعالى ﴿أَءِنَّا لَمَدِينُونَ﴾[2] دەفەرموویت: پاداشتیان دەدرێتەوە.

عبدالرزاق الصنعانی دەفەرموویت: ﴿يوم الدين﴾
ئەو ڕۆژەیە کە (اللّه) حساب لەگەڵ بەندەکانی دەکات لەسەر کردەوەکانی خۆیان.

---

[1] - سُورَةُ الانفِطَارِ: ١٩
[2] - سُورَةُ الصَّافَّاتِ: ٥٣

إبن أبي زمنين له تەفسیرەکەی دەفەرموویت: قەتادة دەربارەی ﴿ملك يوم الدين﴾ وتی ئەو ڕۆژەیە کە (اللّٰه) حساب و لێپرسینەوە لەگەڵ خەڵکی دەکات لەسەر کردەوەکانی خۆیان.

إبن قتيبة الدينوری دەفەرموێت: ﴿**يوم الدين**﴾ واتە ڕۆژی قیامەت، دەڵێ ڕۆژی پاداشت دانەوە و لێپرسینەوە و حساب.

إبن جريج دەفەرمووێت: ﴿ملك يوم الدين﴾ واتە ئەو ڕۆژەیە کە خەڵکی حساب و دادگایی دەکرێن، وەپاداشتی کارەکانیان دەدرێتەوە و بەو پێیە حوکم لەسەر کارەکانیان دەدرێت.

حميد الأعرج دەربارەی: ﴿ملك يوم الدين﴾ دەڵێت: واتە ڕۆژی جزاء (پاداشت).



٥.تەفسیری ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَ إِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾.
خوایه تەنها تۆ دەپەرستین وە تەنها لە تۆ داوای یارمەتی دەکەین.

الضحاك لە إبن عباس وە خوا لێت ڕازی بێت دەفەرمووێت: ﴿إياك نعبد﴾ واتە: خودایە تەنیا هەر تۆ دەپەرستین و لەتۆ دەترسین و هیوامان هەر بەتۆیە نەک کەسی تر.
وە دەفەرمووێت: ﴿و إياك نستعين﴾ پشتیش هەر بەتۆ دەبەستین و گوێڕایەڵی هەر لەتۆ دەکەین لە گشت کارو بارێکماندا.

قتادة دەفەرمووێت: ﴿إياك نعبد و إياك نستعين﴾ خودای گەورە فەرمانتان پێدەکات بە دڵسۆزی بیپەرستن و لەهەموو کردەوە و کارێکتاندا پشت هەر بەئەو ببەستن داوای یارمەتی تەنیا لەو بکەن.

إبن عباس دەربارەی ﴿إياك نعبد﴾ دەفەرمووێت: جبريل عليه السلام بە پێغەمبەری ﷺ وت : ئەی محمد بڵێ : خودایە تۆ بەتاک دادەنێین و لە تۆ دەترسین و داواش هەر لەتۆ دەکەین ئەی پەروەردگارمان جگە لەتۆ کەسی تر نا.

إبن عباس لە تەفسیرەکەی دەربارەی ﴿و إياك نستعين﴾ دەفەرمووێت: خودایە داوای یارمەتی لەتۆ دەکەین لە گوێڕایەڵی و عیبادەت بۆ کردنت و لە هەموو کارێکماندا.

مقاتل بن سلیمان دەفەرمووێت: ﴿إياك نعبد﴾ واتە: خودایە بە تاک و تەنیا هەر تۆ دەپەرستین،

دەلیل هێناوەتەوە دەفەرمووێت: قولە تعالى ﴿عَـٰبِدَٰتٍ﴾[1] دەفەرمووێت: واتە: موحید و یەک خوا پەرستی.

وە دەفەرمووێت: ﴿و إياك نستعين﴾ واتە خودایە لەهەموو عیبادەت و کار و بارێکماندا تەنها داوای یارمەتی لەتۆ دەکەین پشت بەتۆ دەبەستین.

إبن جرير الطبرى دەفەرمووێت: ﴿إياك نعبد﴾ خودایە تەنها داوا لەتۆ دەکەین، تەنها ملکەچ و خۆ بەکەمزان و زەلیل دەبین بۆتۆ کەسی تر نا، تەنها پەنا بە تۆ دەگرین و تەنها لەتۆ دەترسین و هیواو ئومێدمان تەنیا بەتۆیە، دان بە تۆدا دەنێم ئەی پەروەردگارمان لە الربوبية پەروەردگاری و خوایەتیدا نەک بۆ کەس و شتێکی تر.

وە دەفەرمووێت: ﴿و إياك نستعين﴾ واتە ئەی خودایە تەنها داوای یارمەتی لە تۆ دەکەین و پشت بە تۆ دەبەستین لەسەر عیبادەت و کار و کردەوەکانماندا، وە تەنها گوێڕایەڵی تۆ دەکەین لەسەر هەموو ئەمر و فەرمان و کاروبارەکانماندا ،جگە لەتۆ ،کەس وشتێکی تر نا.

---

[1] - سُورَةُ التَّحْرِيمِ: ٥

٦.تەفسیری ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِیمَ﴾.
هیدایەت و ڕێنموونیمان بکە بۆ ڕێگای ڕاست.
إبن عباس لە تەفسیرەکەی ئایەتەکەدا دەفەرموویت: ڕێگەی ڕاست و هیدایەت بخە دڵمانەوە و فێرمان بکە.
إبن عباس دەفەرموویت: ﴿الصرط المستقيم﴾ ئەوە دینی (اللّٰه)یە کە هیچ لارییەکی تێدا نیە واتە(ئیسلام).

جابر لە تەفسیری ئایەتەکەدا دەفەرموویت: ﴿الصرط المستقيم﴾ ئەوە ئیسلامە، کە فراوانترە لە نێوانی ئاسمان و زەوی .

إبن مسعود لە بەشێک لە هاوەڵان ڕیوایەت دەکات دەربارەی ﴿الصرط المستقيم﴾ دەڵێت: ئەوە ئیسلامە.

عبدالرحمن بن زید بن اسلم دەفەرموویت: ﴿الصرط المستقيم﴾ ئەوە ئیسلامە.

أبي العالية دەفەرموویت: ﴿الصرط المستقيم﴾ ئەوە رسول اللّٰه و پاشان هاوەڵانیەتی أبوبکر و عمر واتە ڕێبازی ئەوان واللّٰه اعلم.
على بن أبي طالب دەفەرموویت: ﴿الصرط المستقيم﴾ ڕێگەی ڕاست کتێبی اللّٰهیە واتە (قورئان).

مقاتل بن سليمان دەربارەی ﴿اهدنا الصرط المستقيم﴾ دەڵێت ﴿الصرط المستقيم﴾ ئەمە مانای دینی ئیسلامە چونکە هەر دینێک جگە لە دینی ئیسلام ڕێگەی ڕاست نییە، وە دەڵێت لە خوێندنەوەی إبن مسعود ﴿اهدنا﴾ دەڵێت ڕێنموویيمان بکە .

الضحاك لە إبن عباس وە دەفەرمووێت: ﴿اهدنا الصرط المستقيم﴾ دەڵێت هیدایەتمان بدە وفێرمان بکە و ئیلهامان پێ ببەخشە لەسەر دینی ڕاستەقینەو حەق و دەڵێت ئەمەیە (لا إله إلا الله وحده لا شريك له)

إبن إبي زمنين لە تەفسیرەکەی دەفەرمووێت: ﴿اهدنا﴾ واتە ڕێنموویيمان بکە، ﴿الصرط﴾ دەڵێت واتە ڕێگە و لە ڕیوایەتێکی تر دەڵێت ﴿المستقيم﴾ واتە ئیسلام. والله اعلم.

مجاهد دەربارەی ﴿الصرط المستقيم﴾ دەفەرمووێت: حەقە، والله اعلم مەبەستی وتنی حەق واتە خودایە هیدایەتم بدە بۆ حەق .
إبن عباس دەفەرمووێت: جبريل عليه السلام وتی ئەی محمد بڵێ: ﴿اهدنا الصرط المستقيم﴾ پاشان وتی بڵێ :خودایە فێرمان بکە هیدایەتمان بدە ئیلهامان پێ بدە بە دین وئاینی ڕاستەقینە و حەق، پاشان وتی ئەوە دینی (الله)یە کە هیچ لاری و لادانێکی نییە واتە (ئیسلام).

الحسن البصرى دەربارەی ﴿الصرط المستقيم﴾ دەفەرمووێت: ڕێگەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەدوو هاوەڵەکەی دوای ئەو واتە(ابو بكر و عمر) خوای گەورە لێیان ڕازی بێت.

وە قەولێکی تری دەڵێت: ﴿الصرط المستقيم﴾ واتە دینی ئیسلام.

إبن قتيبة الدينورى لە تەفسیرەکەی دەربارەی ﴿اهدنا الصرط المستقيم﴾ دەفەرمووێت: ﴿اهدنا﴾ واتە ڕێگە، دەلیل هێناوەتەوە قولە تعالى ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ﴾[1]
دەلیل تری هێناوە قولە تعالى ﴿وَإِنَّكَ لَتَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾[2]
بكر بن عبدالله المزني دەفەرمووێت: لە خەودا پێغەمبەری خودام بینی ﷺ پرسیارم لێکرد دەربارەی ڕێگای ڕاست فەرمووی: سوننەتی من و سوننەتی خەلیفەکانی الراشدين دوای من.والله اعلم.
قەولێکی تری هەیە دەڵێت: ڕێگەی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

وأبي بن كعب دەبارەی ﴿اهدنا﴾ دەفەرمووێت: جێگیر ودامەزراومان بکە.

---

[1] - سُورَةُ الأَنۡعَامِ: ١٥٣
[2] - سُورَةُ الشُّورَىٰ: ٥٢

إبن عباس و إسماعيل السدى وأبي ماك و أبي صالح دەربارەی ﴿الصرط المستقيم﴾ دەفەرموون: ئیسلامە.

أبي الحالية دەفەرمووێت: فێری ئیسلام ببە، وە ئەگەر فێری بوویت، لێی هەڵمەگەڕێنەوە، وە پێویستە ڕێگای ڕاست پەیڕەو بکەیت، چونکە ڕێگای ڕاست ئیسلامە، وە لێی لامەدە نەکەی بە لای ڕاست و چەپدا بگەڕێی.

إبن مسعود دەفەرمووێت: ئەم ڕێگایە ڕێگایەکی تەسکە شەیتانەکان ئامادەی دەبن، ئەی بەندەکانی (الله)ئەمە ڕێگایە کەواتە شوێنی بکەون پەیڕەوی لێ بکەن، ڕێگای ڕاست کتێبی (الله)یە واتە (قورئان) بۆیە پابەندبن پێیەوە و دەستی پێوە بگرن.

سعيد بن جبير دەفەرمووێت: ﴿الصرط المستقيم﴾ ڕێگەی بەهەشتە.

اسماعيل السدي دەفەرمووێت: ﴿اهدنا الصرط المستقيم﴾ واتە: هیدایەت و ڕێنماییمان بکە بۆ دین و ئایینێک (ئیسلام)کە خاوەنەکەی بچێتە بەهەشتەوە و سزاو ئەشکەنجە نەدرێت لە دۆزەخ بۆ هەتا هەتایە، وە دەرچوونی لە گۆڕەکەی بۆ بەهەشت بێت. والله اعلم.

## ٧. تەفسیری ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾.

ڕێگای ئەوانەی کە چاکەت لەگەڵ کردوون، نەک ڕێی ئەوانەی خەشمی تۆیان لێ گیراوە ، وە نەک ڕێی ئەوانەی گومڕابوون.

تەفسیری ﴿صرط الذين أنعمت عليهم﴾.

ڕێگایی ئەوانەی کە چاکەت لەگەڵ کردوون.

إبن عباس دەربارەی ﴿صرط الذين أنعمت عليهم﴾ دەفەرمووێت: ڕێگەی ئەوانەی چاکەت لەگەڵ کردوون لە مەلائیکە و پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان و صالیحان، ئەوانەی گوێڕایەڵیت دەکەن و تۆ دەپەرستن.

ابن عباس لە ڕیوایەتێکی تر دەفەرمووێت: ڕێگەی ئیمانداران.

إبي العالية دەفەرمووێت: ﴿صرط الذين أنعمت عليهم﴾ ڕێگەی پێغەمبەری خوایەﷺ وە ڕێگەی دوو هاوەڵەکەیەتی ، أبو بكر و عمر خوای گەورە لێیان ڕازی بێت.

مجاهد دەربارەی ﴿صرط الذين أنعمت عليهم﴾ دەفەرمووێت: ڕێگەی ئیمانداران.
قەولێکی تری هەیە دەفەرمووێت: ڕێگەی پێغەمبەران.

ربيع بن أنس دەربارەی ﴿صرط الذين أنعمت عليهم﴾ دەفەرمووێت: ڕێگەی پێغەمبەران.

وكيع دەفەرمووێت: ﴿أنعمت عليهم﴾ واتە ڕێگەی موسوڵمانان.

عبدالرحمن بن زيد بن اسلم دەربارەی ﴿صرط الذين أنعمت عليهم﴾ دەفەرمووێت: ڕێگەی پێغەمبەری خوا ﷺ وە ئەوانەی لەگەڵی بوون.

عكرمة مولى لە إبن عباس دەربارەی ﴿أنعمت عليهم﴾ دەفەرمووێت: جێگیر و دامەزراومان بکە لەسەر ئیمان و خۆڕاگری و ڕاستگۆیی، الإستقامة پێ ببەخشە لەسەری.

شهر بن حوشب دەفەرمووێت: ئەوە ڕێگەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوایە ﷺ وە ڕێگەی أهل البيت.

مقاتل بن سليمان دەربارەی ﴿صرط الذين أنعمت عليهم﴾ دەفەرمووێت: واتە ڕێباز و ڕێگەی ئەوانەی کەتۆ چاکەت لەگەڵ کردوون پێت بەخشیون و ڕێگای ئەوانمان نیشان بدە. ﴿انعمت عليهم﴾ دەفەرمووێت: ڕێگەی پێغەمبەران ئەوانەی کە خودا چاکە و نیعمەتی بەسەردا ڕشتوون و پێ بەخشیون، واتە: ڕێگەی ئەو پێغەمبەرانەی کە خودا پێغەمبەرایەتی پێبەخشیون و چاکەی لەگەڵ کردوون، دەلیل هێناوەتەوە قولە تعالی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾[1]

إبن قتيبة الدينوری لە تەفسیرەکەی دەربارەی ﴿صرط الذين أنعمت عليهم﴾ دەفەرمووێت: واتە ڕێگەی پێغەمبەران و ئیمانداران.



[1] - سُورَةُ مَرْيَمَ: ٥٨

تەفسیری ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾.

نەک ڕێگەی ئەوانەی خەشمی تۆیان لێ گیراوە ، وەنەک ڕێگەی گومڕایان ئەوانەی گومڕابوون.

تەفسیری ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾.

إبن عباس دەفەرمووێت: ئەوانەی خەشم و توڕەیی (الله)یان لێ گیراوە بریتین لە یەهود، جولەکە.

إبن عباس و عبدالرحمن بن زید و باوکی زید بن أسلم و أبي صالح و السدی و مجاهد و ربیع بن أنس و سعید بن جبیر و عکرمة دەڵێن: یەهودە، جولەکە.

الضحاك و إبن وهب و الحسن البصری و إبن قتیبة الدینوری ئەمانە ، وە إبن مسعود ڕیوایەت دەکات لە بەشێک لە هاوەڵان دەفەرموون: یەهودە ، جولەکە.

مقاتل بن سلیمان دەربارەی ﴿غير المغضوب عليهم﴾ دەفەرمووێت: ئەوە دینی یەهودە کە (الله) غەزەبی لێ گرتوون و خەشم و توڕەی (الله)یان لێ گیراوە. دەلیل هێناوەتەوە قولە تعالی ﴿وَجَعَلَ مِنۡهُمُ ٱلۡقِرَدَةَ وَٱلۡخَنَازِيرَ﴾[1]

---

[1] - سُورَةُ المَائِدَةِ: ٦٠

عبدالرڕزاق الصنعانی و إبن ابي زمنين  و سفيان بن عيينة له تەفسیرەکەیان دەفەرموون: یەهودە، جولەکە.

عدی بن حاتم دەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿ان المغضوب عليهم﴾ واتە یەهود، جولەکە.

عبدالله بن شقيق دەگرێتەوە لە أبي ذر دەفەرمووێت: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لەسەر ﴿المغضوب عليهم﴾ وەڵامی دایەوە فەرمووی : ئەوە یەهودە ، جولەکەیە.

اسماعيل بن أبي خالد دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خودا ﷺ، دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: ﴿المغضوب عليهم﴾ یەهودە.



## تەفسیری ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾.

إبن عباس و عكرمة و عبدالرحمن بن زيد و باوكی زيد بن اسلم و مجاهد و السدی و ابي صالح و ربيع بن أنس و سعيد بن جبير لە تەفسیرەكەیدا دەفەرموون: ئەوانە نەصاران .

الضحاك و إبن وهب و الحسن البصری و إبن قتيبة الدينوری ئەمانە ، وە إبن مسعود ڕیوایەت دەكات لە بەشێک لە هاوەڵان دەفەرموون: نەصاران، گاورەكان.

عدی بن حاتم دەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿ولا الضالين﴾ فەرمووی: نەصارا .

مقاتل بن سليمان لە تەفسیرەكەی دەربارەی ﴿ولا الضالين﴾ دەفەرمووێت: ئەوە دینی موشریكینە، واتە: نەصاران.

عبدالڕزاق الصنعانی و إبن ابي زمنين و سفيان بن عيينة لە تەفسیرەكەیان دەفەرموون: ئەوانە نەصاران.

عبد الله بن شقيق دەگرێتەوە لە أبي ذر دەفەرمووێت: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لەسەر ﴿**ولا الضالين**﴾ وەڵامی دایەوە فەرمووی : ئەوانە نەصاران.

اسماعیل بن أبي خالد دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿**والضالون**﴾ نەصاران.



## تەفسیری ﴿آمین﴾

حسن البصری پرسیاری لێکرا دەربارەی (آمین) تەفسیر و لێکدانەوەکەی چیە: فەرمووی: واتە خودایە لێمان قبوڵ بکە وەڵام بدەرەوە.

وەرگیراوە لە تەفسیر: (ابن جرير الطبري، ابن ابي حاتم، موسوعة تفسير المأثور، إبن قتيبة الدينورى، الضحاك، ابن ابي زمنين، مقاتل بن سليمان، الحسن البصرى، مجاهد عبدالرزاق الصنعانى ،إبن مسعود، سفيان بن عيينة، ابن جريج) وغيرها.



بەم فەرموودەیە کە دەربارەی ام القران (الفاتحة) هاتووە کۆتایی بە نامیلکەکە دێنم.

قال رسول الله صلى الله عليه وسلم :

قالَ اللهُ تعالى : قسمتُ الصَّلاةَ بيني وبينَ عبدي نصفين ، ولعبدي ما سألَ ، فإذا قالَ العبدُ : ﴿ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ ، قالَ اللهُ تعالى : حمدني عبدي . وإذا قالَ : ﴿ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾ . قالَ اللهُ تعالى : أثنى عليَّ عبدي . وإذا قالَ ﴿ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ﴾ . قالَ : مجّدني عبدي ( وقالَ مرّةً: فوّضَ إليَّ عبدي ) فإذا قالَ : ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ . قالَ : هذا بيني وبينَ عبدي ولعبدي ما سألَ . فإذا قالَ : ﴿ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ﴾ . قالَ : هذا لعبدي ولعبدي ما سألَ .

رواه مسلم

(أبو هريره) خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: من لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە فەرموویەتی: خوای گەورە فەرموویەتی: نوێژم لە نێوان خۆم و بەندەکەمدا کردووە بە دوو بەشەوە، بەندەکەم داوای چی کرد دەیدەمێ، هەر کاتێ وتی: ﴿الحمد لله رب العالمين﴾ خوای گەورە دەفەرمووێت: بەندەکەم سوپاسی کردم، هەرکاتێ وتی: ﴿الرحمن الرحيم﴾ خوای گەورە دەفەرمووێت: بەندەکەم ستایشی کردم، هەرکاتێ وتی: ﴿مالك يوم الدين﴾ خوای گەورە دەفەرمووێت: بەندەکەم گەورە ومەزن سەیری کردم جارێکیش فەرمووی: بەندەکەم هەموو شتێکی خۆی دایە دەست من کاتێ وتی: ﴿إياك نعبد و إياك نستعين﴾ خوای

گەورە دەفەرمووێت: ئەمە لە نێوان من و بەندەکەمدایە ، بەندەکەم چی بووێت بۆی دەکەم، کاتێ وتی: ﴿**اهدنا الصرط المستقيم صرط الذين انعمت عليهم غير المغضوب عليهم ولا الضالين**﴾ خوای گەورە دەفەرمووێت: ئەمە تایبەتە بە بەندەکەم داوای چیش بکات بۆی دەکەم.[1]



[1] -﴿حديث قدسي﴾،﴿صحيح مسلم ٣٩٥﴾.

# كۆتایی نووسەر

الحمدلله لە نووسین و تەواوبوونم لە لێکدانەوەی ئەم نامليكەيە داواكارم لە الله لێمان قبوڵ بکات ببێتە تێشوويەک بۆ قیامەت و ببێتە سوودێک بۆ موسوڵمانان.

وە هەر ڕاستیەك و حەقێک نووسرا بێت لە الله تعالى يەوە هەرچی هەڵە و کەم و کورتیە لە نەفسی ئێمەیە الله تعالى لێمان قبوڵ بکات.

**(اللهم ارنا الحق حقا وارزقنا اتباعه, وارنا الباطل باطلا وارزقنا إجتنابا.)**

ڕێکەوت ٢١ جمادى الأخرة. ساڵی ١٤٤٥ کۆچی/ بەرامبەر بە ٣/١ ساڵی ٢٠٢٤ زایینی، شەوی پێنج شەممە.

براتان: عبدالله الكردى.

﴿وصلى الله على محمد وعلى آله وصحبه آجمعين﴾.